هێمای "ق" ئاماژەی بۆ كرابوو، كە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەم فەرموودەیە "مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ"یە..

لێیان پرسیم: ئایا ئەمە فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ یان نا؟

پێم وتن: بەڵێ، فەرموودەیەكی پیرۆزی پێغەمبەرە ﷺ و دەبێ پشت بە بڕیاری یەكگرتنی ئیمامی بوخاری و موسلیم لەسەر ڕیوایەتی فەرموودەی ناوبراو لەم كتێبە باوەڕپێكراوەدا ببەستن و متمانەی پێ بكەن. بەڵام هەروەك قورئانی پیرۆز ئایەتی موتەشابیهی تێدایە، فەرموودەی پیرۆزیش بە هەمان جۆر موتەشابیهی تێدایە و، زانایانی خەواص نەبێ كەس لە واتا وردەكانیان ناگات.

هەروەها وتم:

لەوانەیە ڕواڵەتی ئەم فەرموودە پیرۆزە لە بەشی موتەشابیهاتی موشكەلی حەدیث بێت.

خۆ ئەگەر لە دەمی ئەو پرسیارەدا ئاگام لەو موناقەشەیە بوایە كە سەبارەت بە فەرموودەی ناوبراو كرابوو، تەنها بەو كورتە وەڵامەوە نەدەوەستام، بەڵكو بەم جۆرەی خوارەوە وەڵامی پرسیارەكەم دەدانەوە:

**یەكەم:**

مەرجی یەكەمی موناقەشەكردنی ئەم چەشنە مەسەلانە بریتییە لەوەی كە:

ئەو گفتوگۆیە لە كەشوهەوای بەكارهێنانی ویژداندا بێت و.. بە نیازی گەیشتن بە "حەق" بكرێت و.. لە شێوەیەكدا بێت كە سەرسەختی و عینادیی

---

وجلَّ عليه عينَه، وقال: ارجع فقل له يضعُ يدَه على مَتْنِ ثَوْر، فله بكلِّ ما غَطَّتْ بـه يـدُه بكـلِّ شَعْرَةٍ سَنَةٌ، قال: أي رَبِّ ثُمَّ ماذا؟ قال: ثُمَّ المَوْت. قال: فالآن. فسألَ اللّهَ أنْ يُدنِيَه مِن الأرضِ المُقَدَّسة رَمْيَةً بحَجَر. قال: قال رسولُ اللّه ﷺ: فلو كُنْتُ ثَمَّ لأريتُكم قَبْرَهُ إلى جانبِ الطريـق عند الكثيب الأحمـر. رواه البخـاري ١٣٣٩ و٣٤٠٧ ومسـلم ٢٣٧٢ وأحمـد ١٥٧ و ١٥٨ والنسائي ١١٩/٤، ١١٨ والبيهقي ١٢٠. وانظر تعليق الحافظ في الفـتح ٤٤٢/٧ عـلى هـذا الحديث فإنّه نفيس.

تێدا بەكار نەیەت و.. لە نێوان ئەوانەشدا بێت كە ئەهلی موناقەشەن، بـێ ئەوەی ببێت بەهۆی تێگەیشتنی خراپ و بەهەڵەوەرگرتنی مەسەلەكە..

تەنهـا لە ناوەنـدی ئەم مەرجـانەدا موناقەشـەكردنی ئەم مەسـەلەیە و مەسەلەكانی هاوچەشنی دروست دەبێت.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی كە ئەو موناقەشـەیە لەپێنـاوی گەیشـتندایە بە حەق، ئەوەیە كە:

موناقەشەكار هیچ شتێك لە دڵدا هەڵنەگرێت و.. گەر "حەق" لەسەر زمـانی بەرامبەرەكەی دەركەوت دڵگـران و تـووڕە نەبێـت، بەڵكـو دڵنیـا و ڕازی بێـت. چونكە شتێكی نوێ فێر بووە كە زووتـر نەیـدەزانی، خـۆ ئەگەر "حەق" لەسـەر زمـانی خـۆی دەربكەوتـایە، زانسـتێكی نـوێ فێـر نەدەبـوو، بەڵكـو لەوانەیە دووچاری "غروور" ببوایە!

**دووهەم:**

ئەگەر بابەتی گفتوگۆ لەسەركراو فەرموودەیەكی پیرۆز بێت، دەبـێ پلەكـانی "حەدیث" و دەرەجەكانی "وەحیـی ضـیمنی" و بەشـەكانی "گوفتـاری نەبەوی" بزانرێن، ئنجا گفتوگۆی تێدا بكرێت..

هەروەهـا دروسـت نیـیە لە نێـوان عەوامـی خەڵكیـدا گفتوگـۆ لەسـەر گیروگرفتەكانی فەرموودە بكرێت، یان مرۆڤ بۆ پیشاندانی سـەركەوتنی خـۆی بەسەر كەسانی تردا بەرگری لە ڕا و بۆچوونەكانی خۆی بكات..

هەروەهـا نابێـت بە دوای ئەو بەڵگـانەدا بگەڕێـت كە پـتر گەشـە بە "لەخۆباییبوون"ی دەدەن و ڕاكەی بەسەر حەق و ویژداندا تەرجیح دەدەن.

بەڵام مادەم مەسەلەكە پـێش‌چـاو خـراوە و، موناقەشـە و وتـووێژی لەسـەر كراوە، ئەوا كاریگەریی خراپ لە تێگەیشتنی ئەو عەوامانەدا بەجێ دەهێڵێـت كە ناتوانن لەم چەشنە فەرموودە موتەشابیهانە تێبگەن.

چــونكە ئەگەر یەكێــك لەو عەوامــانە ئینكــاریی بكــات ئەوا دەرگــایەكی لەناوچوون و زیانی لە خۆی خستووەتە سەرپشت، لەبەر ئەوەی ئەم ئینكاری و ملنەدانەی بەرەو ئینكاریی چەندین فەرموودەی چەسپاوی صەحیح دەیداتەبەر. خۆ ئەگەر ئەو واتایەشی پێ قبووڵ بێــت كە ڕواڵەتی فەرمــوودەكە بە دەســتیەوە دەدات و لەنــاو خەڵكیشــدا بــڵاوی بكــاتەوە، ئەوا دەبێــت بەهــۆی كــردنەوەی دەرگــای ڕەخــنە و ئیعتیــرازی گومڕایــان و زمانــدرێژییان بەرامــبەر فەرمــوودە پیرۆزەكە و بواریان بۆ دەڕەخسێنێت كە ناوی خورافاتی لێ بنێن!

جا لەبەر ئەوەی، بە بێ هیچ داخوازێكی پێویســت، بەڵكــو بە چەشــنێك كە زیــانی تێــدا بێــت، ســەرنجی خەڵــكی بــۆ ئەم فەرمــوودە پیــرۆزە موتەشــابیهە ڕاكێشــراوە و، گەلــێ فەرمــوودەی تــری موتەشــابیهی وەك ئەمەش هەن، ئەوا پێویســتە بــۆ دوورخســتنەوەی شــوبهەكان و نەهێشــتنی گومــان و وەهمەكــان "حەقیقەت"ێك ڕوون بكــرێتەوە. چــونكە ســەرەڕای چەســپاویی فەرمــوودەكە، ڕوونكردنەوەی ئەم حەقیقەتەش بە كارێكی پێویست دەزانم.

وا بە پوختی ئاماژە بۆ ئەو حەقــیقەتە دەكەیــن و، بــۆ درێــژەكەشی پشــت بە پەیامەكانی نوور دەبەستین وەك:

(لقــی ســێهەم و چــوارەمی وتەی بیســت و چــوارەم و، ئەو بنچیــنەیەش كە تایبەتە بە "بەشەكانی وەحی"یەوە لە پێشەكیی مەكتووبی نۆزدەهەمدا).

**حەقیقەتەكەش ئەمەی خوارەوەیە:**

مەلائیكەت وەك ئادەمیزاد نین تا تەنها لە یەك شێوەی دیاریكراودا بن، بەڵكو هەرچەنــد خــاوەنی شــێوەی دەستنیشــانكراوی خۆیــانن، كەچــی لە حــوكمی "كوللی"دان.

جا حەزرەتی عیزرائیلیش - دروودی لەسەر بێت - سەرۆك و سەرپەرشتیاری ئەو مەلائیكەتانەیە كە كاری "گیانكێشان"یان پێ سپێرراوە.

**پرسیار:**

ئایا هەر خودی حەزرەتی عیزرائیل - دروودی لەسەر بێت - گیانەکان دەکێشێت، یان هاوکار و یاریدەدەرانی؟

**وەڵام:**

سێ ڕێباز لەم ڕووەوە هەن:

**ڕێبازی یەکەم:**

خودی حەزرەتی عیزرائیل - دروودی لەسەر بێت - گیانی هەموو کەسێك دەکێشێت. چونکە سەبارەت بەو هیچ کارێك ڕێی کارێکی تری لێ ناگرێت، لەبەر ئەوەی زاتێکی "نووراني"یە و شتی نوورانیش دەتوانێت بەهۆی چەند ئاوێنەیەکی بێسنوورەوە بە خودی خۆی لە چەندین شوێنی زۆر و بێسنووردا ئامادە بێت. چونکە خۆنواندنەکانی شتانی نووراني لەناو شتی تردا تایبەتکارییەکانی خودی ئەو زاتە نوورانییەیان تێدایە و بە خودی ئەو - نەك غەیری ئەو - دادەنرێن..

بۆ نموونە:

هەروەك خۆدەرخستنەکانی "خۆر" لەناو ئاوێنە جۆراوجۆرەکاندا "ڕووناکی" و "گەرمیی خۆر" دەردەخەن، خۆدەرخستنی ڕۆحانییەکانی وەك مەلائیکەتانیش لە ئاوێنە جۆراوجۆرەکانی "جیهانی میسال"دا هەمان تایبەتکارییەکانی ئەوان وەردەگرن. کەواتە ئەو خۆدەرخستن و خۆنواندنانەی ئەوان لەو ئاوێنانەدا خودی ئەو ڕۆحانییانەن نەك غەیری خۆیان.

جا مەلائیکەتەکان بەپێی توانا و قابیلییەتی ئاوێنەکان لەو ئاوێنانەدا دەردەکەون. بۆ نموونە:

حەزرەتی جیبریل - دروودی لەسەر بێت - لەو کاتەی کە لە بەردەم پێغەمبەر ﷺ و ناو کۆڕی هاوەڵە بەڕێزەکانیدا - خوایان لێ ڕازی بێت - لە شێوەی

هاوەڵی بەڕێــز "دیحـیەی کەلبـی"دا[١] دەردەکەوت، هەر لە هەمـان کـات و لە هەزاران شــوێندا بە چەنــد شــێوەیەکی جۆراوجــۆر دەردەکەوت و، هەر لەو دەمەشدا باڵە فراوان و بەسام و شکۆدارەکانی خـۆرهەڵات و خۆرئاوایـان[٢] پـڕ کردبووەوە و، سـوژدەشی لە ژێـر عەرشی هەرەمەزنـدا دەبـرد. کەواتە حەزرەتی جیبریل لە زۆر شوێندا و بەپێی توانایی و قابیلییەتی ئەو شوێنە و بە یەك کات لە هەزاران شوێندا خۆی دەردەخات.

جا بەپێی ئەم ڕێبازە:

نە بە کارێکی مەحاڵ و.. نە بە دیاردەیەکی نائاسایی و.. نە بە ئیشـێکی دوور لە ژیری دادەنرێت کە وێنەی ئەو مەلائیکەتی گیانکێشانە لە سەرەمەرگ و دەمی گیانکێشــانی مرۆڤــدا - کە نمــوونەیەکی جـوزئیی مــرۆڤە - زلــلەی حەزرەتی مووســای - درووودی لەســەر بێـت - لـێ بـدرێت، کە کەســایەتییەکی مەزن و بەســام و شــکۆی نێــوان پێغەمــبەرانی "ئولــولعەزم"ە، پاشــان چــاوی وێـنە میســالییەکەی مەلائـیکەتی گیانکێشــان دەربهێنێــت کە پۆشــاکی ئەو وێــنە و شێوەیەی لەبەر کردووە.

**ڕێبازی دووهەم:**

مـەلائیـکـەتـە مەزنەکانی وەك: حـەزرەتی جیبریل و میکائیـل و عیزرائیــل - درووودیان لەسـەر بێـت - هەر یەکەیـان وەك سـەرگەورە و سەرپەرشـتیارێکی گشتی وان کە چەند یارمەتیدەرێکیان لە جـۆری خۆیـان هەیە و - بە شـێوەیەکی بچووکتر - لەوان دەچن. ئەو یارمەتیدەرە بچووکانەش بەپێی جۆراوجـۆریی ئەو

(١) بڕوانە: البخاري: المناقب ٢٥؛ فضائل القرآن ١. مسلم: فضائل الصحابة ١٠٠.

(٢) بڕوانە: البخاري: بدء الوحي ٣؛ بدء الخلق ٧؛ تفسير سورة المدثر ٣-٥؛ مسلم: الإيمـان ٢٥٥، ٢٥٧-٢٥٨.

بەدیهـــاتووانەی کە سەرپەرشـــتیکردنیان خـــراوەتە ئەســـتۆیانەوە، جیاجیـــا و جۆراوجۆرن.

بۆ نموونە:

ئەو مەلائیکەتـانەی کە گیـانی پیاوچاکـان[1] دەکێشـن جیـاوازن لەوانەی کە گیانی پیاوخراپان دەکێشن. کەواتە مەلائیکەتەکانی گیانکێشـان بەپێـی ئامـاژەی ئایەتە پیرۆزەکانی ﴿وَالنَّازِعَاتِ غَرْقاً ۞ والناشِطاتِ نَشْطاً﴾ (النازعات:١-٢) چەنـد دەستە و تاقمێکی جیاجیا و جۆراوجۆرن.

جا بەپێی ئەم ڕێبازە:

حەزرەتی مووسـا - دروودی لەسـەر بێـت - زلـلەی لە خـودی حەزرەتی عیزرائیل - دروودی لەسەر بێت - نەداوە، بەڵکو لە ڕووی هێـز و هەرەتی مەزنی پێغەمبەرایەتییەکەی و.. گەورەیی جەستەی و.. بەهێزیی ڕەوشتی و.. پلەوپایەی لای پەروەردگاری بەتوانای خۆی، زللەی لە جەستەی یەکێـك لە یاریـدەدەرانی حەزرەتی عیزرائیل داوە.

بەم جۆرە، دەردەکەوێت کە ئەم کارە بەلای ژیرییەوە گەلێ پەسەندە[2].

---

(١) کاتێ یەکێك لە ئەولیا مەزنەکانی ناوچەکەمان کە بە "سـەیدا" بەناوبـانگە لە سـەرەمەرگدا بووە و مەلائیکەتی بەرپرسی گیانکێشـان هـاتووە گیـانی بکێشـێت، پەنـای بە خـوای گەورە بـردووە و بە دەنگـی بەرز هـاواری کـردووە: "بـا ئەو مەلائـیکەتە گیـانی مـن بکێشـێت کە گیانکێشانی قوتابیانی زانستی خراوەتە ئەسـتۆ، چـونکە زۆرم خـۆش دەوێـت" ! هەمـوو ئەو کەسانەی کە لە کاتی وەفاتیدا ئامادە بوون شایەتییان لەسەر ئەمە داوە. (دانەر)

(٢) شارەکەمان پیاوێکی ئازای تێدا بوو. لە سەرەمەرگدا بە مەلائیکەتی گیانکێشانی وت: "ئـا بەم حـاڵەتەوە کە لە جێگـادا کەوتـووم گیـانم دەکێشـیت؟!". ئەمەی وت و بە سـووکی لە جێگاکەی هەڵسا و سواری ئەسپەکەی بوو، ئنجا شمشێرەکەی ڕاکێشـا وەکـو ئەو کەسـەی لە مەیدانی جیهاد و شمشێرکاریدا بێت. ئیتر بەو جۆرە و بە سواری ئەسپەکەیەوە گیانی سـپارد و بە مردنی مەردانی بەغیرەت وەفاتی کرد! (دانەر)

**ڕێبازی سێهەم:**

لە بنچینەی چوارەمی وتەی بیست و نۆهەمدا ڕوونمان کردەوە و، بەپێی بەڵگەی چەند فەرموودەیەکی پیرۆزیش دەردەکەوێت کە:

هەندێك مەلائیکەت هەن کە چل هەزار سەریان هەیە و[1]، هەر سەرەش چل هەزار زمانی تێدایە - واتە هەشتا هەزار چاویشیان هەیە - هەر یەك لەو زمانانەش چل هەزار جار تەسبیحاتی خوای گەورە دەکات.

جا مادەم ئەو مەلائیکەتە کار پێ سپێرراوانە بەپێی جۆرەکانی "جیهانی بینراو" کاریان خراوەتە ئەستۆ و لە جیهانی گیانەکاندا تەسبیحاتی ئەو جۆرانە دەنوێنن و دەریدەخەن، ئەوا دەبێ لەسەر هەمان شێوە و ڕوخساریش بن، چونکە زەوی - بۆ نموونە - یەك بەدیهاتووی خواوەندە و تەسبیحاتی بۆ دەکات کەچی چل هەزار بەڵکو سەدان هەزار جۆر بەدیهاتووی تێدایە کە هەریەکەیان لە حوکمی چەند سەرێکی تەسبیحاتگوزاردان و، هەریەك لەو جۆرانەش هەزاران تاك و دانەیان هەیە کە وەك چەند زمانێك وان... هتد.

کەواتە ئەو مەلائیکەتەی کە سەرپەرشتیی کاروباری زەویی پێ سپێرراوە، دەبێ چل هەزار بەڵکو سەدان هەزار سەری هەبێت و، هەریەك لەو سەرانەش سەدان هەزار زمانی تێدا بێت... هتد.

جا بە گوێرەی ئەم ڕێبازە:

حەزرەتی عیزرائیل - دروودی لەسەر بێت - ڕوویەکی تایبەتیی بۆ هەموو کەسێك هەیە کە بەو ڕووەی بۆ ئەو کەسە دەڕوانێت و چاوێکیشی هەیە کە سەیری ئەوی پێ دەکات..

ئنجا حەزرەتی مووساش - علیە السلام - هەرگیز زللەی لە ماهییەتی کەسێتیی حەزرەتی عیزرائیل و شێوە ڕاستەقینەکەی نەداوە و سووکایەتیی پێ

(١) تفسير الطبري: ١٥٦/١٥؛ تفسير ابن كثير: ٦٣/٣.

نەكردووە و دەستی بە ڕوویەوە نەناوە، بەڵكو هەڵسوكەوتەكەی ئەو لەو حەز و ڕەغبەتەوە سەرچاوەی گرتووە كە حەزی لە بەردەوامبوون و مانەوەی ئەركی پێغەمبەرایەتی كردووە. بۆیە لەبەر ئەمە، زلـلەی وەشـاند و بۆیشـی هەیە بیوەشێنێت، لەو چاوەی كە موراقەبەی ئەجەلەكەی دەكات و دەیەوێت كۆتایی بە كارمەندییەكەی ئەم لەسەر زەویدا بهێنێت!

واللّهُ أعْلَمُ بالصَّواب.

ولا يعَلْمُ الغَيْبَ إلاّ هو.

﴿قُلْ إنمَّا الْعِلْمُ عِنْدَ اللّهِ﴾ (الملك:٢٦).

﴿هُوَ الَّذى أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتابَ مِنهُ آياتٌ مُحْكَماتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتابِ وَأُخَرُ مُتَشابِهاتٌ فَأَمَّا الَّذينَ فى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ ما تَشابَهَ مِنْهُ ابْتِغاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغاءَ تَأْويلِهِ وَما يَعْلَمُ تَأْويلَهُ إلاّ اللّهُ وَالرَّاسِخُونَ فى الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنا وَما يَذَّكَّرُ إلاّ أُولُوا الألْبابِ﴾ (آل عمران:٧).

* * *

## پێشەكیی یازدەهەمی
## كتێبی "موحاكەمات"

# چەند مەسەلەیەك
# لە دووتوێی یەك مەسەلەدا

هەنـدێ جـار تەنهـا یەك گوفتـار چەنـدین بڕیـار لەخـۆ دەگرێـت، ئەوەتـا دەگونجێ یەك صەدەف گەلێ مرواریی تێدا بێت.

ئنجا لە لای ژیران و هۆشمەندان ئەوەش سەلماوە كە:

تەنهـا یەك مەسـەلە چەنـدەها مەسـەلەی تـر لەخـۆ دەگرێـت، هەر یەك لەو كێشانەش بەروبوومێكی جیاواز لە هـی ئەوی تـر بەرهەم دەهێنێـت، هەروەك لە بنەڕەت و بناغەیەكی جیاوازەوە هەڵقوڵاوە و سەری هەڵـداوە. جـا ئەو كەسـەی كە توانای لێك جیاكردنەوەی نییە، لە حەق لادەدات و لێی نامۆ دەبێ..

نموونەی ئەمە:

لە فەرموودەی پیرۆزدا هاتووە كە:

(بُعِثْتُ أنا والساعةُ كهاتين)(١).

واتە: لە دوای من هەتـا قیـامەت پێغەمـبەری تـر نـایەت. ئیـتر مەبەسـت لە فەرموودەكە هەرچی بێت، هەر حەقە.

ئەم فەرموودە پیرۆزە سێ بڕیاری لەخۆ گرتووە:

---

(١) حديث صحيح أخرجه البخاري ٦٥٠٥ من حديث أبي هريرة رضي اللّهُ عنـه. وهـو حديث متواتر. انظر النظم المتناثر في الحديث المتواتر ص ١٤٣ برقم ١٨٧. (وەرگێڕ)

**یەکەمیان:** ئەم وتەیە گوفتاری پێغەمبەرە ﷺ.. ئەم بڕیارە دەرەنجامی تەواتورە، گەر ببێت. (واتە ئەگەر فەرموودەکە موتەواتیر بێت).

**دووهەمیان:** واتا و مەبەست لەم گوفتارەدا حەق و ڕاستە.. ئەم بڕیارەش دەرەنجامی ئەو بەڵگەیە کە پشتی بە موعجیزاتی پێغەمبەرﷺ بەستووە، "چونکە پێغەمبەرﷺ جگە لە ڕاستی هیچ گوفتارێکی تری لێ نابیسترێ".

جا دەبێ یەکگرتن لەسەر ئەم دوو بڕیارە هەبێت، چونکە ئەو کەسەی ئینکاریی یەکەم بکات، درۆزن و نەسەلمێنەری حەقە.. ئەو کەسەش ئینکاریی دووهەم بکات گومڕایەکە بەرەو تاریکییەکان پێی خلیسکاوە و کەوتووەتە خوارەوە.

**بڕیاری سێهەم:** واتا و مەبەست لەم گوفتارە ئەمەیە (واتە ئەمەیە کە من دەیڵێم). ئەمەش مرواریی ناو صەدەفەکەیە.

ئەم بڕیارە دەرەنجامی ئیجتیهادە، نەك هی حەز و ئارەزوو. چونکە شتێکی زانراوە کە داوا لە موجتەهید ناکرێ تەقلیدی موجتەهیدانی تر بکات.

ئەم مەسەلەی سێهەمەیە کە سەرچاوەی ئیختیلاف و جیاوازییەکانە..

باشترین شایەت لەسەر ئەمە، هەموو ئەو وتە جیاجیا و دژبەیەکانەیە کە لە "تەنها یەك مەسەلە"دا دەیبینین.

جا ئەو کەسەی ئینکاریی ئەم مەسەلەیە بکات بە سەرسەخت و ملنەدەر و گومڕا دانانرێت و، پێی بەرەو کوفر ناترازێ، بە مەرجێ ئینکارییەکەی لە ئیجتیهادەوە سەرچاوەی گرتبێت..

چونکە شتی گشتی(عام) بە نەبوونی شتی تایبەتی(خاص) بە نەبوو دانانرێت و نەفی ناکرێت. زۆر دەقی بێگومان (قطعي المتن)یش هەیە کە گومان لە دەلالەتیدا دەکرێ و (ظني الدلالة)یە. کەواتە دەبێ لە دەرگاکانەوە بڕۆینە ناو خانووەکان، ئەوەتا هەموو ماڵێك دەرگای تایبەت بە خۆی هەیە و، هەموو قفڵێکیش کلیلی تایبەتیی بۆ دانراوە.

**کۆتایی:**

ئەم سێ مەسەلەیە هەروەك لە "فەرموودە"دا هەیە، لە "ئایەت"یشدا هەیە، چونکە چەند مەسەلەیەکی گشتین. بەڵام یەکەمیان جیاوازییەکی وردی تێدایە.

بەم جۆرە دەرکەوت کە:

هەندێ جار گوفتارێك چەند حوکم و بڕیارێکی زۆر لەخۆ دەگرێت، بەڵام چەند حوکمێکی تایبەتن و، لە بناغەدا هەریەکەیان لەوی تر جیایە و، بەروبوومێکی جیاواز لە هی ئەوی تر بەرهەم دەهێنێت.

**بێدارکردنەوەیەك:**

گەر کەسێك بیەوێت لەم چەشنە مەقامانەدا خەریکی "بەهەڵەبردن" بێت، لەوانەیە چەند بڕوبیانوویەکی بێنرخ و بەهانەگەلی لاواز بدۆزێتەوە، کە لە خۆشویستنی خۆیەوە سەریان هەڵداوە، وەك:

پشتگیریی لایەنی بەرامبەر و نەیار و.. دەمارگیریی نەفرەت لێکراو و.. حەزی خۆدەرخستن و.. هەستی لایەنگیری بۆ لایەك و.. پاساوهێنانەوە بۆ وەهم و ئەندێشەکان، بەوەی کە بیانگێڕێتەوە بۆ بناغەیەك و.. بینینی شتانی لاواز بە شێوەیەکی بەهێز، لەبەر گونجانی لەگەڵ حەز و مەیلە کەسییەکان و.. دەرخستنی تەواوی و کەماڵی خۆی، بە شکاندن و کەمکردنەوەی شان و شکۆی خەڵکانی تر و.. خۆدەرخستنی بە "ڕاستگۆ" لە ڕێی بەدرۆخستنەوەی ئەوانی تر و.. پیشاندانی ڕاسترەویی خۆی، بە گومڕا دەرکردنی خەڵکی و.. شتانی تری نزم و سووکی وەك ئەمانە.

(وإلىَ اللّه الْمُشتَكى).

واتە: سکاڵامان تەنها بۆ لای خوای گەورەیە.

* * *

مەقامی یەکەمی

بریسکەی چواردەهەم

# لە نێوان "حەقیقەت" و "تەشبیهـ"دا

بإسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

برای ئازیز و ڕاست و بەوەفام کاك ڕەئفەت!

ئەو پرسیارەی کە لە بارەی گا و نەهەنـگ (الثَـوْر والحُـوت)ەوە کردبـووت، وەڵامەکەی لە هەنـدێ پەیامـدا هەیە. ئنجـا لە "لقـی سـێهەمی وتەی بیسـت و چوارەم"یشدا دوازدە قاعیدەی گرنگ لە ناوەنـدی دوازدە دەسـتووردا سـەبارەت بەم جۆرە پرسـیارانەوە ڕوون کـراونەتەوە و، ئەو دەسـتوورانە چەنـد بنـاغەیەکی گەلێ گرنگن بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر وەهم و گومانێـك ئاراسـتەی فەرمـوودە پیرۆزەکـان بکرێـت و، هەریەکەیـان پێـوەرێکی باشـن بـۆ دەرخسـتنی تەئـویلە جۆراوجۆرەکانی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ.

برام! مـن تەنهـا سـەرقاڵی ئەو بابەتـانەم کە "سـنووحات"ن و کتـوپڕی وەك دەرفەت بۆ "دڵ" دێن و، بە داخەوە - ئێستا - چەند حاڵەتێکی ئەوتۆ هەن بـواری ئەوەم نادەن خەریکی باس و بـابەتە زانسـتییەکان بـم. بـۆیە نـاتوانم وەڵامـێکی تێروتەسەلی پرسیارەکەتان بدەمەوە. خـۆ ئەگەر خـوای گەورە تەوفیـق بـدات و دەرگای "سنووحات" لە دڵ بکاتەوە ئەوا ناچار دەبـم پێیـانەوە سـەرقاڵ بـبم و، لەوانەیە تەنها وەڵامی ئەو جۆرە پرسیارانە بدرێنەوە کە لەگەڵ ئەو سـنووحاتانەدا بگونجێن.

جا تكـام وایە لەوە دڵگـران نەبـن كە نـاتوانم وەڵامـی تێروتەسـەلی هەمـوو پرسیارەكانتان بدەمەوە. بەڵام بـا ئەم جارەیـان وەڵامـێكی كـورتی پرسـیارەكەت بدەمەوە.

**برام! لە پرسیارەكەتاندا باسی ئەوەتان كردووە كە:**

زانایانی ئایین دەڵێن: زەوی لەسـەر "گـا و نەهەنـگ" ڕاگیـر كـراوە. كەچـی جوگرافیا بە هەسارەیەكی هەڵواسراوی دەبینێت كە وەك هەموو هەسارەكانی تـر بەناو بۆشایی ئاسماندا هاتوچۆ دەكات، نە گا لە گۆڕێدا هەیە و نە نەهەنگ!

**وەڵام:**

ڕیوایەتێك لە زاتـێكی وەك "ئیـبن عەببـاس"ەوە - خوایـان لـێ ڕازی بێـت - دەگێڕنەوە كە دەڵێت[١]:

پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ كرا: زەوی لەسەر چی ڕاوەستاوە؟

لە وەڵامدا فەرمووی:

"علَى الثَّوْر والحُوت".

---

(١) دانەر لە كتێبێكی تریدا بە ناوی (موحاكەمات) سەبارەت بەو ڕیوایەتە، وتوویەتی:
لەبارەی ئەوەی كە زەوی لەسەر (گا و نەهەنگ) بێت حەدیسێك ڕیوایەت كراوە. بەڵام:
یەكەم: نایسەلمێنین كە فەرموودەی پێغەمبەرﷺ بێـت، چـونكە نیشـانەی "ئیسـرائیلیات"ی پێوەیە!
دووهەم: ئەگەر بیشسەلمێت كە فەرموودەی پێغەمبەرەﷺ ، ئەوا حەدیسێكی "ئاحاد"ە و لەبەر لاوازیی پەیوەندییەكانی نێوان سەنەدەكەی "ظەن" دەگەیەنێـت، نەك "یەقـین". كەواتە نـاڕواتە بواری بابەتەكانی عەقیدەوە، چونكە ئەو بوارە "یەقین" دەگرێت بە مەرج.
سێهەم: تەنانەت ئەگەر "موتەواتیر" و "قطعيُّ المتن"یش بێت، "قطعيُّ الدلالة" نییە.
لەگەڵ ئەوەشدا، خەڵكانی ڕواڵەتبین، لەوانەی كە شـوێنی خەیـاڵ و ئەندێشـە كەوتـوون، ئەم حەدیسەیان لە واتا ڕاستەكەی خۆی ترازاندووە.
ئەم حەدیسە - گەر بسەلمێت فەرموودەی پێغەمبەرەﷺ - سێ ڕووی ڕاستی هەیە.
(دانەر لە دەقەكەی سەرەوەدا ڕووە ڕاستەكانی ڕوون كردووەتەوە). (پەراوێزی وەرگێڕ)

ڕیوایەتێکی تر دەڵێت جارێك لە وەڵامـدا فەرمـوویەتی: " عـلَىَ الثَّـوْر" و لە وەڵامێکی تردا فەرموویەتی: "عَلَى الحُوت"[١].

بەڵام هەندێ کەس لە "مُحَدِّثين" ئەم ڕیوایەتانەیان بەسەر چەند چیـرۆکێکی ئەفسـانەیی و "ئیسـرائیلیات"دا شـکاندووەتەوە، بە تـایبەت ئەو ئەفسـانە و حیکایەتانەی کە لە زانا نۆموسـڵمانەکانی بەنی ئیسـرائیلەوە بیسـتراون لەوانەی کە واتای فەرموودەکەیان گۆڕیوە و، بە جـۆرێکی گەلـێ سـەیر و نـامۆ لێکیـان داوەتەوە و، بەسەر چەند داسـتان و چیرۆکێکـدا شـکاندوویانەتەوە کە لە کتێـبە پێشووەکاندا سەبارەت بە گا و نەهەنگەوە باس کراون.

وا ئێستا لێرەدا و بۆ مەبەستی وەڵامـدانەوەی پرسـیارەکەت، ئـێمە بە کـورتی ئاماژە بۆ سێ بناغە و سێ ڕووی ئەم مەسەلەیە دەکەین:

❏ **بناغەی یەکەم:**

دوای ئەوەی کە هــەندێ لە زانایـانی "بەنی ئیسـرائیل" موسـڵمان بـوون، زانستەکانی پێشوویان لەگەڵ خۆیاندا هێنابووە نـاو ئیسـلام. واتە بـوون بە مـاڵ بەسەر ئیسلامەوە و لە لایەن خەڵکەوە بە زانسـتی ئیسـلامی تەماشـا کـران. لە کاتێکدا کە زانسـتە پێشـووەکانی ئەوان گەلـێ هەڵەیـان تێـدا بـووە. کەواتە ئەو هەڵانە هی ئەوانن، نەك هی ئیسلام.

❏ **بناغەی دووهەم:**

هەرکاتێ "تەمثیل" و "تەشبیهەکان" لە دەستی کەسانی تایبەتمەند دەربچـن و بکەونە دەستی عەوامەکان، واتە لە دەستی زانستەوە بکەونە ناو دەسـتی نەزانی، ئەوا بە تێپەڕبوونی کات وەك ڕاسـتی و "حەقیقەت" دادەنرێن و لەوە دەردەچـن کە وەك تەشبیهـ تەماشا بکرێن!

---

(١) بڕوانە: المسـتدرك: ٦٣٦/٤ رقـم ٨٧٥٦؛ الترغيـب والترهيـب ٢٥٨/٥ وقـال: في متنـه نكارة، والله أعلم. (وەرگێڕ، لە چاپە عەرەبییە تازەکەوە)

بۆ نموونە: لە تافی منداڵیمدا جارێكیان مانگ گیرا، لە دایكمم پرسی: چی بەسەر مانگدا هاتووە؟ وتی: مار قووتی داوە! وتم: خۆ هێشتا هەر دەبینرێت؟ وتی: ماری ئاسمان وەك شووشە وایە، ناوەوەیان دیارە!

زۆر جار كە ئەم ڕووداوەم دەهاتەوە یاد، لە خۆمم دەپرسی: خورافەتێك كە تا ئەم ڕادەیە لە ڕاستییەوە دوورە، چۆن كەوتووەتە سەر زاری ئەو دایكە ژیرەی كە لە گوفتارەكانیدا تابڵێی جیددییە و هەرگیز توخنی گاڵتەوگەپ ناكەوێت؟!

پاشان كە زانستی گەردوونناسیم خوێندەوە، بۆم دەركەوت كە ئەوانەی بە چەشنی دایكم دیاردەی مانگگیران لێكدەدەنەوە، تەشبیهیان بە وێنەی ڕاستییەكی بەرجەستە وەرگرتووە! چونكە گەردوونناسەكان، لە تەشبیهێكی جواندا، ئەو دوو كەوانەیەی كە لە تێكەڵبوونی بازنەی خۆر - كە ناوچەی بورجەكان و خولگەی پلەكانیانە - و بازنەی مانگ - كە میل و خولگەی مەنزڵەكانی مانگە - پێكهاتووە، بە دوو ماری گەورەیان شوبهاندوون و ناوی هەژدیهایان لێ ناون. ئنجا یەكێك لە دوو خاڵی یەكتربڕینی ئەو دوو بازنەیان ناو ناوە "سەر" و ئەوی تریشیان ناو ناوە "كلك". جا كاتێ كە مانگ دەگاتە ئاستی "سەر" و خۆریش دەگاتە ئاستی "كلك" ئەوا - وەك گەردوونناسەكان دەڵێن - زەوی دەكەوێتە نێوان هەردووكیانەوە و دیاردەی مانگگیران ڕوو دەدات. واتە بەپێی ئەو تەشبیهەی پێشوو مانگ دەچێتە گەرووی هەژدیهاكەوە!

بەم جۆرە، ئەم تەشبیهە زانستییە بەرزەی كە بە تێپەڕبوونی كات كەوتە ناو گوفتاری عەوامەكانەوە، كرا بە هەژدیهایەكی بەرجەستەی هێندە گەورە كە مانگ قووت بدات!

بە هەمان جۆر، ئەو دوو مەلائیكەتەش كە "ثَوْر" و "حُوت"یان پێ دەوترێت، بە تەشبیهێكی بەرز و جوان و بە مەبەستی ئاماژەیەكی پڕ لە واتا ئەو ناوانەیان لێ نراوە. كەچی هەر ئەوەندەی بە تێپەڕبوونی كات ئەم تەشبیهە لە زمانی بەرز و ڕەوانگۆی پێغەمبەرێتییەوە كەوتە ناو زمانی عەوامەكان، بە ڕاستییەكی

بەرجەستە تەسەوور کرا و، ئەو دوو مەلائیکەتە شێوەی گایەکی زل و نەهەنگێکی زەبەلاحیان بە بەردا برا!

❑ بناغەی سێهەم:

هەروەك قورئانی پیرۆز ئایەتی "موتەشابیهات"ی تێدایە و، لە ڕێی تەشبیهـ و تەمسیلەوە ڕێنمایی عەوامەکان بۆ بابەت و باسە ورد و قووڵەکان دەکات.. فەرموودەی پێغەمبەریش ﷺ بە هەمان جۆرە، چەند موتەشابیهێکیان تێدایە و، لە ڕێی بەکارهێنانی تەشبیهەوە - کە عەوامەکان پێی ڕاهاتوون - ڕاستییە فراوانەکان دەردەبڕن. نموونەکانی ئەمەمان لە پەیامەکانی تردا باس کردووە، وەك ئەوەی کە:

جارێکیان لە کۆڕی پێغەمبەردا ﷺ دەنگێك هاتە گوێی ئامادەبووان. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە بەردێکە حەفتا ساڵە بۆ ناو دۆزەخ بەردەبێتەوە، وا ئێستا گەیشتە بنکی دۆزەخ.. دوای تێپەڕبوونی چەند خولەکێك، کەسێك هاتە ناو کۆڕەکە و وتی: فڵانە مونافیق مرد کە تەمەنی حەفتا ساڵ بوو! بەم هەواڵەش ئەو حەقیقەتە ڕاستەی ناو تەشبیهە بەلیغەکەی پێغەمبەری ﷺ دەربڕی[1].

سەبارەت بە پرسیارەکەشەوە، ئەوا سێ ڕوو لێرەدا باس دەکەین:

❍ ڕووی یەکەم:

خوای گەورە لە "عەرش" و "ئاسمانەکان"دا چوار مەلائیکەتی مەزنی بۆ سەرپەرشتی کردنی کاروباری دەستەڵاتداریتیی خۆی تەرخان کردووە، یەکێکیان ناوی: "نَسْر"ە و یەکێکی تریشیان ناوی: "ثَوْر"ە[2].

---

(١) بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە (٩). (وەرگێڕ)

(٢) عن مالك فی قوله عز وجل: ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّموات والأرضَ﴾ قال: إن الصخرة التی تحت الأرض السابعة، ومنتهی الخلق، علی أرجائها أربعة من الملائكة، لكل مَلَك منهم أربعةُ وجوه: وجهُ إنسان ووجهُ أسد، ووجهُ نسر، ووجهُ ثَوْر، فهم قيام عليها قد أحاطوا بالأرض والسموات ورؤوسُهم تحتَ الكرسيِّ والكرسيُّ (تحتَ) العرش. قال: وهو واضع

بەڵام "زەوی" كە برای بچووكی ئاسمانەكان و هاوڕێی هەسارە گەڕۆكەكانە، دوو مەلائیكەتی سەرپەرشتیكاری بۆ دانراوە كە هەڵیدەگرن و، یەكێكیان پێی دەوترێت: "ثَور" و، بەوی تریشیان دەوترێت: "حُوت"..

نهێنی و حیكمەتی ئەم دوو ناوەش لەوەدایە كە:

زەوی دوو بەشە: وشكایی و دەریا. واتە خاك و ئاو. ئەو شتەش كە دەریا و ئاوەكان ئاوەدان دەكاتەوە نەهەنگ یان ماسییە. ئەوەش كە وشكایی و خاك ئاوەدان دەكاتەوە "گا"یە، چونكە مایەی ژیانی مرۆڤ بریتییە لە كشتوكاڵ كە ئەو ئەركەش لە ئەستۆی "گا" نراوە.

كەواتە ئەو دوو مەلائیكەتەی كاروباری زەوییان پێ سپێرراوە، بریتین لە دوو پێشەوا و سەرپەرشتیكاری زەوی، بۆیە لە ڕوویەكەوە جۆرە پەیوەندییەكیان بە تیرەی نەهەنگ و ڕەگەزی "گا"كانەوە هەیە. لەوانەشە - والعِلْمُ عِنْدَ اللّهِ - لە جیهانی مەلەكووت و میسالدا لەسەر شێوەی گا و نەهەنگ دەربكەون[1].

---

رجلَيه تبارك وتعالى على الكرسي. أخرجه عبد اللّه بنُ الإمام أحمد في كتاب (السنة) برقم ٥٨٩، ٣٠٣/١ في إسناده مجهول والمدى معروف بالوهم وبقية رجاله ثقات. وعزاه السيوطيُّ في الدر المنثور ٣٢٩/١ لعبد بن حميد وأبو الشيخ في العظمه وأخرجه أيضاً البيهقي في الأسماء والصفات ص/٤٠٣ وقد أخرجه عبد الرزاق وعبد بن حميد وابن المنذر كما في الدر المنثور باختلاف في السياق ٢٦١/٦ من كلام وهب بن منبه وهو ثقة كثير النقل من كتب الإسرائيليات. (انظر الميزان ٣٥٢/٤).

(١) بەڵێ، گۆی زەوی وەك كەشتییەك وایە كە بەسەر دەریای بۆشایی ئاسماندا دەڕوات. جا ئەو كەسەی كە - بە فەرمانی خوای گەورە - ئەم كەشتییە زەبەلاحە بێ هەست و ژیانە، بەوپەڕی ڕێكوپێكی دەخاتە گەڕ، واتە كەشتیوانی كەشتیی زەوی، ئەو مەلائیكەتەیە كە ناوی "حُوت"ی لێ نراوە.. هەروەها زەوی - وەك بە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ چەسپاوە - كێڵگەی دوارۆژە. كەواتە ئەو مەلائیكەتەی كە - بە ڕوخسەت و فەرمانی خوای گەورە - سەرپەرشتیی ئەو كێڵگەیە دەكات، ناوی "ثَوْر"ی لێ نراوە. خۆ ئاشكراشە كە ئەم ناوە جوانە چەندە لەگەڵ ئەو ئەركەدا گونجاوە! (دانەر)

جا به مەبەستی ئاماژەکردن بۆ ئەم پەیوەندییە و، وەك هێمایەك بۆ ئەو دوو جۆرە بوونەوەرانەی ناو زەوی، پێغەمبەر ﷺ کە خاوەنی زمانی موعجیزەبەیان و گوفتاری بەپێزی پڕ واتایە، فەرمووی:

"الأرضُ علَى الثَّوْر والحُوت"..

واتە بە یەك ڕستەی کورت حەقیقەتێکی هێندە مەزن و قووڵی دەربڕی کە لەوانەیە نەتوانرێت بە لاپەڕەیەکی تەواو دەرببڕێت!

❍ ڕووی دووهەم:

گەر بوترێ: دەوڵەت لەسەر چی ڕاگیر دەکرێت؟

لە وەڵامدا دەوترێت: "عَلَى السَّيْفِ وَالْقَلَم"..

واتە پاڵ بە هێزی ئازایەتیی شمشێری سوپاوە دەدات و، لەسەر وریایی و دادگەری قەڵەمی کارمەندەکان ڕاگیر دەبێت.

جا لەبەر ئەوەی "زەوی" نیشتەجێ و خانە و لانەی زیندەوەرانە و، سەرداری زیندەوەرانیش مرۆڤە و، بەشی هەرە زۆری مرۆڤیش لە کەناری دەریا و ڕووبارەکاندا دەژین و گوزەرانیان لەسەر ڕاوە ماسییە و، بەشەکەی تری مرۆڤیش گوزەرانیان لەسەر کشتوکاڵ بەندە کە ئەرکی ئەویش لە ئەستۆی "گا"دایە و، تەوەرەی بازرگانیشیان لەسەر ماسییە.. ئەوا هەروەك توانرا بوترێ: "تقومُ الدولةُ عَلَى السَّيْفِ وَالْقَلَم" دەشتوانرێت بوترێ: "تقومُ الأرضُ علَى الثَّوْر والحُوت". چونکە هەرکات "گا" لە کارەکەی مان بگرێت و ماسییەکانیش - کە بە یەك جار ملیۆنەها گەرا دادەنێن - واز لە گەرا دانان بهێنن، ئەوا گوزەرانی مرۆڤ هێندە شپرز دەکەن کە ژیان مەیسەر نەبێت و بەدیهێنەری داناش گۆی زەوی کاول دەکات و لەناوی دەبات.

بەم جۆرە، پێغەمبەری ئازیز ﷺ بە دانایەکی بەرز و ڕەوانبێژییەکی ئیعجازبەخش و تەنها بە دوو وشەی کورت وەڵامی پرسیارەکەی دایەوە و،

ڕاستییەكی فراوانی ڕوون كردەوە و، مەودای پەیوەندیی ژیانی مرۆڤی بە زیندەوەرانەوە دەرخست و، فەرمووی: "الأرضُ علَى الثَّوْر والحُوت"[1].

❍ ڕووی سێهەم:

زانایانی گەردووناسیی كۆن پێیان وابووە كە "خۆر" بە دەوری زەویدا دەسووڕێتەوە و، هەموو سی پلەیەكی خۆریان ناوناوە "بورج". جا ئەگەر چەند هێڵێكی گریمانكراو بە نێوان ئەستێرەكانی ئەو بورجانەدا بهێنرێت ئەوا هەندێ جار شێوەی شێرێك.و، هەندێ جاری تر شێوەی تەرازوویەك، یان گایەك، یان نەهەنگێك دەردەچێت. بۆیە ئەو ناوانەیان لەو بورجانە ناوە.

بەڵام زانستی گەردووناسیی نوێ پێی وایە كە "خۆر" بە دەوری زەویدا ناسووڕێتەوە، بەڵكو زەوی بە دەوری "خۆر"دا دەسووڕێتەوە. واتە ئەو بورجانە لەكار دەخات. كەواتە دەبێ هەریەك لەو بورجە لەكارخراوانە و ئەو بازنە گەورە و زەبەلاحانە، لە خولگەی ساڵانەی زەویدا چەند بازنەیەكیان - بە پێوەرێكی بچووكتر - هەبێت. ئەو كاتە "زەوی" هەموو مانگێك دەچێتە سایەی یەكێك لەو بورجانە و لە ناوەندی دەركەوتنی ئەودا دەبێت. وەك بڵێی خولگەی ساڵانەی زەوی ئاوێنەیەك بێت ئەو بورجانەی تێدا دەربكەوێت!

جا لەسەر بناغەی ئەم ڕووەی مەسەلەكە، وەك پێشتر وتمان، پێغەمبەر ﷺ جارێك لە وەڵامدا فەرمووی: "عَلَى الثَّوْر" و جارێكی تر فەرمووی: "عَلَى الحُوت"!

بەڵێ، شایانی ئەو زمانە ئیعجاز دەرخەرەی پێغەمبەری ئازیزە ﷺ كە جارێك بفەرموێ: "عَلَى الثَّوْر" و بەمەش ئاماژە بۆ ڕاستییەك بكات كە دوای چەند

(١) روى عن عطاء بن يسار حديث موقوف على كعب فيه ذكر الحوت، قال عنه البوصيري: رواه الحارث ورواته ثقات. بڕوانە: (المطالب العالية) للحافظ ابن حجر العسقلاني. الطبعة المحققة. ٤/٤٦-٤٧. (وەرگێڕ)

ســەدەیەك دەردەكەوێــت، چــونكە "زەوی" لە دەمــی ئەو پرســیارەدا لە وێــنە میسالیيەكەی بورجی "ثَوْر"دا بــووە. بەڵام كە دوای مانگێـك هەمـان پرسـیاری ئاراستە كراوەتەوە، فەرموویەتی: "عَلَى الحُـوت" چـونكە "زەوی" لەو دەمەدا لە ژێر سایەی بورجی "حُوت"دا بووە!

بەم پێیە و، بە فەرموودەی: " علَى الثَّوْر والحُوت"، پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بـۆ ئەم ڕاستییە مەزنە كرد كە لە ئایندەی وەڵامەكەیدا پتر ڕوون بووەوە و دەركەوت. بەمەش ئاماژەی بۆ بزووتن و گەشتی زەوی كرد و، بە هـێما ئەوەی ڕاگەیانـد كە بورجە ئاسمانییە ڕاستەقینە و كارگوزارەكان لە خـولگەی سـاڵانەی زەویـدان و، هەر گۆی زەویـیە كە بەو ئەركە ڕادەپەڕێـت و لەو بورجـانەدا گەشـت دەكـات. بەڵام ئەو بورجانەی كە بە خەیاڵ هی سووڕگەی خۆرن، هیچ تەن و قەبارەیەكی گەڕۆكیان تێدا نییە!

واللّهُ أعلَمُ بالصَّوابِ.

سـەبارەت بەو چیرۆكـانەش كە لە بـازنەی ژێـری بەدەرن و لە بـارەی گـا و نەهەنــگەوە دەدوێــن و لە كتێــبە ئیســلامییەكاندا بــاس كــراون، ئەوا یــان "ئیسرائیلیات"ن.. یـان چەنـد تەشبیهــ و نموونەهێنـانەوەیەكن.. یـان تەئـویلی هەندێ كەسن لە ڕاوییەكان، بەڵام ئەو كەسانەی كە بە وردی لە شت ناكۆڵنەوە، بە هی خودی فەرموودەكەیان زانیوە و داویانەتە پـاڵ پێغەمـبەری خۆشەویسـت ﷺ.

﴿رَبَّنَا لا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِيْنَا أَوْ أَخطَأْنَا﴾.

﴿سُبحَانَكَ لا عِلمَ لنا إلاّ ما عَلَّمْتَنا إِنكَ أَنتَ العَليمُ الحَكيمُ﴾.

* * *

## پێشەکیی پێنجەمی
## کتێبی "موحاکەمات"

# لە نێوان "حەقیقەت" و "مەجاز"دا

ئەگەر "مەجـاز" لە دەسـتی زانسـتەوە بکەوێـتە دەسـتی نەزانی، ئەوا بە "حەقیقەت"ی[1] دادەنێت و دەرگای ئەفسانەکانیشی پێ دەخاتە سەرپشت..

چونکە هەرکات دەستی تـاریکی نەزانی "مەجـاز" و "تەشـبیهەکان"[2] لە دەستی ڕووناکی بەخشـی زانسـت بکـاتەوە، یـان هەر بەو شـێوەیە کاتیـان بەسەردا بڕوات و تەمەنیان درێژ ببێـت، ئەوا وەك "ڕاسـتی"یان لـێ دێـت و، هەمـوو تەڕی و پاراوییەکیـان لەدەسـت دەچێـت و، دەبـن بە سـەرابێکی خەڵەتێنەر، هەرچەندەش پێشتر شـەربەتێکی زوڵاڵ بـوون و.. دەگـۆڕێن بە پیرەژنێکی چـرچ و لۆچـاوی، دوای ئەوەی کیـژۆڵەیەکی دڵڕفێنـی ناسـکۆڵە بوون!

بەڵـێ، تروسـکایی "حەقـیقەت" لە ڕوونی و شـەفافییەتی "مەجـاز"ەوە دەبریسـکێتەوە، بەڵام هەر هێنـدەی ئەو "مەجـاز"ە کـرا بە "حەقـیقەت" دەگۆڕێت بە چڕییەکی تاریکی ئەوتۆ کە حەقیقەتە ئەسڵییەکە دادەپۆشێت!

---

(١) "حەقیقەت" و "مەجاز" دوو زاراوەی ڕەوانبێژین. مەبەست لە "حەقیقەت" بەکارهێنانی وشـەیە لەو واتـایەدا کە یەکەم جـار بـۆی دانـراوە. وەك ئەوەی سـەبارەت بە هەڵهـاتنی "خۆر"ی ئاسمان بڵێیت: "خۆر هەڵهات". بەڵام "مەجاز" بەکارهێنانی وشەیە لە واتـایەکی تری جیاواز لە واتـا ڕاسـتەقینەکەیدا، لەبەر ئامـانجێکی ڕەوانبێـژی. وەك ئەوەی کە ئەگەر خۆشەویسـتێکت لـێ دەربـکەوێ بڵێیـت: "خـۆر هەڵهـات". مەبەستیشـت لە "خـۆر" خۆشەویستەکەت بێت! (وەرگێڕ)

(٢) "تەشبیهـ" بە کوردی: "وەك یەك". زاراوەیەکی ڕەوانبێـژییە. واتە لێچوانـدنی شـتێك بە شتێکی تر. بۆ نموونە: "ئەم کاغەزە هێندە سپییە دەڵێی بەفرە"! (وەرگێڕ)

ئەم ئاڵوگۆڕەش یاسایەکی سروشتیی خوای گەورەیە.

گەر شـــایەتت لەســـەر ئەمە دەوێ، ئەوا ســـەردانی نهێنیـــی تـــازەبوونەوە و ئاڵوگۆڕی ناو "زمانەکان" بکە و، هاوبەشی و هاوتایی شتە هاوتا و هاوبەشەکان ببینە، ئەوکاتە بێ هیچ گومانێك لێیان دەبیستی کە دەڵێن:

گەلێ وتە و چیرۆك و ئەندێشە و واتای ئەوتۆ هەبـوون کە پێشـینان چێژیـان لـێ دەبـردن، بەڵام لەگەڵ حەز و ئـارەزووە لاوەکـانی بەرەکـانی دواییـدا یەك نەکەوتن، چونکە لە سەردەمی ئەمانـدا بـوون بە پیـرەژنی چـرچ و لۆچـاوی کە جوانییـان تێـدا نەمـابوو. هەر ئەمەش بـوو بە هانـدەریان کە مەیلیـان بەلای تازەگەریدا بڕوات و، حەزیشیان لە داهێنان بێت و، پرکێشیی گۆڕانکاری بکەن.

ئەم دەستوورە، هەروەك لە (ئەندێشە و واتا و چیرۆکەکان)دا دەست بەکـارە، بە هەمان شێوە لە "زمان"ەکانیشدا دەستوورێکی کارایە..

کەواتە نابێ بڕیار لەسەر "ڕواڵەت"ی هیچ شتێك دەربکرێت. چونکە ئەرکی سەرشانی مرۆڤی لێکۆڵەر:

(قووڵبوونەوەیە لە ناخی بابەتەکە و.. دەسـتبەرداربوونە لە کاریگەرییەکـانی کات و.. ڕۆچوونە لە قووڵایی ڕابوردوودا و.. لەتەرازووداني هەموو شـتێکە بە پێوەرەکانی ژیری و.. دۆزینەوەی سەرچاوەی شتەکانە).

ئەو بەســەرهاتەی کە شــارەزا و ئاگــاداری ئەم ڕاســتییەی کــردم، ڕوودانی "مانگ گیران" بوو لە دەمی منداڵیمدا..

ئەوەبوو هۆکارەکەیم لە دایکم پرسی. وەڵامی دامەوە کە:

ماری گەورە مانگی قووت داوە!

وتم: ئەی بۆچی دەبینرێت؟

وتی: ماری ئاسمان وەکو شووشە ڕوونە، ناوەوەی دەبینرێت!

جا بڕوانە چۆن "تەشبیهـ" کرا بە "حەقیقەت" و ڕاستیی حـاڵ و ڕووداوەکەی گۆڕی!

چونكە گەردوونناسەكان خاڵی یەكتربڕینی خولگەی مانگ و خۆریان لە ناوچەی بورجەكان و لە سەر و كلكی ئەو دوو كەوانەیەدا شوبهاندووە بە دوو ماری گەورە یاخود دوو هەژدیها و، هەركات یەكێ لە مانگ یان خۆر گەیشتە "سەر"ی یەكتربڕینی كەوانەكان و ئەوی تریش ڕۆشتە "كلك"ی یەكتر بڕینی ئەو دوو كەوانەیە و "زەوی"یش كەوتە ناوەڕاستیان، ئەوا دیاردەی "مانگگیران" ڕوو دەدات.

دەسا ئەی ئەو كەسەی كە لەم قسە تێكەڵ و پێكەڵانەی من بێزار نابێت!

بە وردی سەیری ئەم پێشەكییەش بكە و لێی ورد بەرەوە. چونكە زۆر شتی خیلافی و خورافی لەم بنەچەیەوە سەر هەڵدەدەن. كەواتە پێویستە ڕێنمایی لە "مەنتیق" و "ڕەوانبێژی"[1] وەربگیرێت.

**كۆتایی:** دەبێ "واتای ڕاستەقینە" مۆری تایبەت بە خۆی و نیشانەیەكی ڕوونی جیاكەرەوەی خۆی هەبێت. ئەو شتەش كە نیشانەكەی دەناسێتەوە و بەرجەستەی دەكات ئەو "جوانی"یە پەتی و سەرتاسەرییەیە كە ئەنجامی بەراورد كردنیەتی لەگەڵ ئامانجەكانی شەریعەتدا.

ڕێگادانیش بە "مەجاز" دەبێ بەپێی هەلومەرج و دەستوورەكانی "ڕەوانبێژی" بێت، دەنا بینینی "مەجاز" بە "حەقیقەت" و "حەقیقەت"یش بە "مەجاز".. یان پیشاندانیان لەو شێوەیەدا، جگە لە درێژەدان بە زاڵبوونی "نەزانی" هیچی تری لێ ناكەوێتەوە.

حەزی كورتبڕی كارێك دەكات كە هەموو شتێك بە ڕواڵەتەكەی لێك بدرێتەوە، هەتا - بە داخەوە - وردە وردە بە سەرهەڵدانی ڕێچكەی ڕواڵەتبینان (ظاهیرییەكان) كۆتایی پێ دێت..

---

(١) ناوی دوو زانستن بۆ هەڵسەنگاندن و زانینی ڕاستی و ناڕاستیی گوفتارەكان و هزر و بیرەكان، كە بە بێ بەكارهێنانی یاساكانی ئەم چەشنە زانستانە ئەستەمە مرۆڤ بتوانێ بڕیاری زانستیانە و دروست سەبارەت بەو شتانە بدات. (وەرگێڕ)

حەزکردنیش لە زیادەڕەوی وا دەکات کە بە چاوی "مەجاز" سەیری هەموو شتێك بكرێت، کە ئەمەش لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ڕێچکەی نارەوای "باطینی"یەکان.. جا هەروەك یەکەمیان زیانبەخشە.. دووهەمیان بە چەند پلەیەك زیانی لەو زیاترە.

ئەوەش کە ناوەندەڕێ دەردەخات و، لە سنووربەزاندنی زیادەڕەوی و کورتبڕی دادەگرێت تەنها فەلسەفەی "شەریعەت"ە لەگەڵ "ڕەوانبێژی"دا و.. "حیکمەت"ە لەگەڵ "مەنتیق"دا.

بەڵێ، دەڵێم: حیکمەت (فەلسەفە).. چونکە خێرێکی زۆری هەیە، هەرچەندە شەڕ و زیانیشی لەخۆ گرتووە، بەڵام شەڕ و زیانێکی جوزئییە. خۆ یەکێك لە بناغە سەلماوەکان ئەوەیە کە لە کاتی پێویستدا دەبێ یەکێك لەو دوو شەڕ و خراپەیە هەڵبژێررێت کە زیان و خراپەی کەمترە، چونکە وازهێنان لەو خێرە زۆرەی کە تیایدایە لەبەر زیان و خراپە جوزئییەکەی، ئەوە دەگەیەنێت کە خراپەی زۆر ئەنجام درابێت.

بەڵێ، حیکمەتی کۆن (فەلسەفەی دێرین) خێری کەمە و شتانی خورافی و ئەفسانەشی زۆرن. بۆیە پێشینان - تا ڕادەیەك - ڕێیان بەوە نەداوە کە مرۆڤ پێیەوە سەرقاڵ بێت، چونکە ئەو کاتە "زەینەکان" ئامادە نەبوون و، "بیر"ەکانیش پابەندی چاولێکەری بوون و، "نەزانی"یش بەسەر عەوامدا زاڵ بوو..

بەڵام فەلسەفەی ئێستا، لە ڕووی ماددییەوە و لەچاو فەلسەفەی کۆندا، خێری زیاترە و درۆ و ناحەقیشی کەمترە و، "بیر"ەکانیش لەم سەردەمەدا ئازادن و، "زانین"یش زاڵە بەسەر هەمووان‌دا.

لە ڕاستیدا دەبێ هەموو "زەمان"ێك حوکم و بڕیاری تایبەت بە خۆی هەبێت.

* * *

# لە نێوان "پوختەلێدوان" و "درێژەپێدان"دا

● **خاڵی دووهەم:**

ئەو شتە غەیبییانەی كە پێغەمبەری سەروەریان ﷺ لێ ئاگادار كراوەتەوە، یەكسان نین. چونكە لە هەندێكیان بە شێوەیەكی ڕوون و دوورودرێژ ئاگادار كراوەتەوە و، هەرگیز خۆی دەست لەم بەشە وەرنادات، كە بریتییە لە قورئانی پیرۆز و فەرموودە قودسییە موحكەمەكان..

بەشەكەی تر بە كورتی ئاگادار كراوەتەوە لێیان و، ڕوونكردنەوە و لێدوان و درێژەپێدانیان بە ئیجتیهادی پێغەمبەر ﷺ سپێرراوە. وەك ئەو فەرموودانەی كە لە بارەی ڕووداوەكانی ئایندە و ڕووداوە گەردوونییەكانەوە دەدوێن و لە بناغەكانی ئیمان نین. جا ئەم شتانە، پێغەمبەر ﷺ خۆی بە شێوازی تەشبیهـ و نموونەهێنانەوە و بە ڕەوانبێژیی خۆی و بە چەشنێك لەگەڵ حیكمەتی تەكلیفدا بگونجێت، ڕوونیان دەكاتەوە.

بۆ نموونە: جارێكیان لە كۆڕی پێغەمبەردا ﷺ دەنگی زرمەیەك بیسترا. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئەمە دەنگی بەردێكە ماوەی حەفتا ساڵە بەرەو دۆزەخ بەر دەبێتەوە، وا ئێستا گەیشتە بنكی دۆزەخ"[١]. دوای تێپەڕبوونی چەند

---

(١) بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە (٩).

خولەکێك بەسەر ئەم ڕووداوە سەرنج بزوێنەدا، یەکێك هاتە ناو کۆڕەکە و هەواڵی بە پێغەمبەر ﷺ گەیاند کە: فڵانە مونافیقی تەمەن حەفتا ساڵ مرد و بەرەو دۆزەخ کەوتە ڕێ! ئەم هەواڵەش تەئویلی ڕەوانبێژییە بەرز و بڵندەکەی فەرمایشتی پێغەمبەری ﷺ دەرخست.

**ڕوونکردنەوەیەك:** "ڕوانینی نبووەت" بایەخ بە ڕووداوە جوزئییەکانی ئاینده نادات، لەوانەی کە لە ناوەندی "ڕاستییەکانی ئیمان"دا نین.

● **خاڵی سێهەم:**

بریتییە لە دوو سەرنج:

**یەکەمیان:**

بەشێك لەو فەرموودانەی کە لە شێوەی تەشبیهـ و نموونەهێنانەوەدا ڕیوایەت کراون، بە گوێرەی ڕەوتی ڕۆژگار و زەمان لە لایەن عەوامەکانەوە بە چەند حەقیقەتێکی ماددی وەرگیراون. بۆیە ئەو فەرموودانە لە پێش‌چاوی ئەواندا لەگەڵ واقیعی حاڵ یەك ناگرنەوە، هەرچەندەش دارای ڕاستییەکی چەسپاون.

بۆ نموونە: ئەو دوو مەلائیکەتەی کە - بە وێنەی هەڵگرانی عەرش - هەندێکن لە هەڵگرانی گۆی زەوی و، لەسەر شێوەی "گا" و "نەهەنگ"دان و هەر بەو ناوانەش ناونراون، عەوامەکان بە گایەکی گەورەی ڕاستەقینە و نەهەنگێکی زەبەلاحی ڕاستی تەسەووریان کردوون!

**دووهەمیان:**

هەندێك لە فەرموودەکان لە ڕووی زۆریی موسڵمانان لەو ناوچەیەدا یان لە ڕووی بوونی حکوومەتی ئیسلامی یان مەڵبەندی خەلافەتی ئیسلامی لەو شوێنەدا، هاتووە و ڕیوایەت کراوە. کەچی وا گومان براوە کە مەبەست تیایاندا هەموو موسڵمانان و سەرانسەری جیهانی ئیسلامی بێت و، هەرچەندەش - لە ڕوویەکەوە - تایبەتین کەچی وەك گشتی و هەمەکی وەرگیراون.

بۆ نموونە: لە فەرموودەی پیرۆزدا هاتووە کە:

"لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّىٰ لا يُقَالَ فِي الْأَرْضِ: اللّٰهُ.. اللّٰهُ" [١]..

واتە دەرگای شوێنەکانی زیکری خوای گەورە دادەخرێت و بانگ و قامەت بە تورکی دەدرێت!

● **خاڵی چوارەم:**

هەروەك لەبەر چەند دانست و بەرژەوەندییەکی زۆر چەند شتێکی غەیبیی وەك ئەجەل و مردن پەردەیان بەسەرا دادراوەتەوە، بە هەمان جۆر و لەبەر گەلێ حیکمەتی زۆر هاتنی قیامەتیش، کە سەرەمەرگی دنیا و ئەجەلی مرۆڤ و مردنی زیندەوەرانە، پەنهان کراوە و شارراوەتەوە..

چونکە ئەگەر ئەجەل و ماوەی مردن کاتەکەی دیاری بکرایە، ئەوا ئەو هاوسەنگییەی نێوان ترس و ئومێد (الخوف والرجاء) کە لەسەر بناغەی چەندین بەرژەوەندی و دانایی دامەزراوە، لاسەنگ دەبوو. ئەو کاتەش نیوەی تەمەن بە بێئاگاییەکی سەرتاسەری بەسەر دەچوو، لە نیوەکەی تریشیدا ترسێکی یەکجار سامناکی وەك ئەوە ڕووبەڕووی مرۆڤ دەبووەوە کە هەنگاو بە هەنگاو بەرەو پەتی قەنارە بدرێتەبەر.

ئەجەل و سەرەمەرگی دنیاش (واتە بەرپابوونی قیامەت) کتومت وەك ئەمە وایە. چونکە ئەگەر کاتەکەی دیاریکراو بوایە، ئەوا سەدەکانی پێشین و ناوەڕاست، مەگەر بە کەمی و شێوەیەکی جوزئی، دەنا بیری دواڕۆژ کاری تێنەدەکردن. بەڵام سەدەکانی دوایی لە ترس و لەرزێکی بەردەوامدا دەژیان و، ئەو کاتەش هیچ لەزەت و نرخ و بەهایەك بۆ ژیان نەدەمایەوە و، پەرستشی

---

(١) حديث صحيح عن أنس بن مالك رضي اللهُ عنه. رواه مسلم: ١٤٨؛ وأحمد والترمذي. وقال الحاكم (٤/٤٩٤): هذا حديث صحيح على شرط الشيخين ولم يُخرِّجاه. (وەرگێڕ، لە چاپە عەرەبییەکەوە)

مرۆڤیش، کە بریتییە لە گـوێڕایەڵیی ئەو کەسـە بە ئیختیـاری خـۆی لە ناوەنـدی ترس و ئومێددا، هیچ گرنگی و حیکمەتێکی تێدا نەدەما.

پاشـان ئەگەر کـاتی بەرپـابوونی قیـامەت دیـاریکراو بـوایە ئەوا بەشـێکی "ڕاستییەکانی ئیمان" دەڕۆشتە ناو بازنەی شتانی بەدیهی و بەڵگەنەویستەوە. واتە هەموو خەڵکی - بیانویستایە یـان نەیانویسـتایە - تەسـدیقیان دەکـرد. دیـارە ئەو کـاتەش نهێنیـی تەکلیـف و حـیکمەتی ئـیمان، کە پەیوەنـدییان بە ویسـت و ئیختیاری مرۆڤەوە هەیە، لە شوێنی خۆیدا دەترازا و تێکدەچوو.

بەم جۆرە و لەبەر چەندین بەرژەوەندیی زۆری وەك ئەمانە، شتان و کاروبارە غەیبییەکان پەنهان کراون، لە ئەنجامی ئەمەشدا مـرۆڤ لە هەمـوو خولەکێکـدا هەروەك چـاوەڕێی مـانەوەی ژیـانی دەکـات چـاوەڕوانی هـاتنی ئەجەلەکەشی دەکات و پێکەوە بیر لە هەردووکیان دەکاتەوە و، بە گەرموگوڕی بـۆ ئەم دنیـا و ئەودنیـاش تێدەکۆشـێت. هەروەهـا وەك لە هەمـوو چەرخێکـدا چـاوەڕوانی بەرپابوونی قیامەت دەکات، گریمانی مانەوەی دنیاش لەو چەرخەدا دادەنێـت. هۆی ئەمەیە کە مرۆڤ دەتوانێت لە دەماودەمی ڕوانینیـدا بـۆ فەنـا و تیـاچوونی دنیـا کـار بـۆ ژیـانی هەمیشـەیی ئەودنیـا بکـات و لە هەمـان کاتـدا بـۆ ئاوەدانکردنەوەی دنیاکەی هەوڵ بدات، وەك بڵێی هەتاهەتایە لە دنیادا بژی!

پاشان گەر بهاتایە و کاتی هاتنی بەڵا و موسیبەت و گیروگرفتەکان بزانـرایە، ئەوا مـــرۆڤ لە ئەنجـــامی چـــاوەڕوانکردنی هـــاتن و دابـــارینی ئەو بەڵا و موســـیبەتانەوە چەنـــدین ئەوەنـــدەی ئـــازاری خـــودی بەڵا و موسـیبەتەکان ئەشکەنجە و ئازاری مەعنەویی دەچەشت! بۆیە دانست و میهرەبـانیی فـراوانی خوای گەورە، موسیبەت و گیروگرفتەکـانی داپۆشـیوە و، سـەبارەت بە مـرۆڤ پەنهانی کردوون و، پەردەی بەسەردا داونەتەوە، تـاکو مـرۆڤ ئەو جـۆرە ئـازارە مەعنەوییە نەچێژێت.

جـا لەبەر ئەوەی زۆربەی ڕووداوە گەردوونیـــیە غەیبییەكـــان ئەم چەشـــنە حیكمەتانەیان تێدایە، ئەوا ڕێی هەواڵدان لە غەیب داخـراوە. تەنـانەت ئەوانەش كە بە فەرمـانی پەروەردگـار هـــەواڵی لـێ دەدەن تەنهـــا لە شـــێوەی چەنـد ئاماژەیەكـــدا و بە جـــۆرێكی تەمـــاوی و دوور لە ڕاشـــكاوی و ئاشـــكرایی ڕایدەگەیەنن. جگە لە "ڕاستییەكانی ئیمان" و ئەو شـتانەی كە مـایەی تەكلـیفن. تاكو كەمرێزی و گوێڕایەڵی نەكردنی تەواوەتی بەرامـبەر بەم دەسـتوورە خـواییە ڕوونەدات كە دەفەرموێت:

﴿قُلْ لا يَعْلَمُ مَنْ فِي السَّمٰوَاتِ وَالأَرْضِ الْغَيْبَ إِلّا اللّٰهُ﴾ (النمل:٦٥).

تەنـــانەت ئەو مـــژدانەش كە لە تەورات و ئنجیـــل و زەبـــووردا لە بـــارەی پێغەمبەری سەروەرمانەوە ﷺ هاتوون، تا ڕادەیەك تەماوین و ڕاشكاو نـین. هەر ئەمەش بووە بەهۆی ئەوەی كە هەندێ لە شوێنكەوتەی ئەو كتێبانە تەئـویلی ئەو ئاماژانە بكەن و لە ئەنجامـدا نـیعمەتی ئیمانهێنـان بەو پێغەمـبەرە ئـازیزە ﷺ لە كیسی خۆیان بدەن.

بەڵام ئەو مەســـەلانەی كە لە ناوەنـــدی "عەقیـــدە" و بیروباوەڕەكـــانی "ئیمان"دان، ئەوا بەپێی خواستی حیكمەتی تەكلیف پێویستیان بە ڕاگەیانـدنێكی ئەمین و ڕوونییەكی تەواوەتی و ڕاشكاوییەكی كامڵ و دووپاتبوونەوە هەیە. بۆیە قورئـــانی پیـــرۆز و ڕاگەیەنەرە ئەمیـــنەكەی ﷺ زۆر بە ڕوونی و تێروتەســـەلی كاروبارەكانی قیامەتیان ڕوون كردووەتەوە، لە كاتێكدا كە ڕووداوە ئایندەییەكانی دنیایان بە كورتی و پوختی باس كردووە.

* * *

# پوختەیەک لە ژیانی دانەر

* ناوی "بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی"یە .
* لە گوندی "نوورس"ی نێو چیا بڵندەکانی سەر بە پارێزگای "بەدلیس"ی کوردستانی ژێر دەستەڵاتی عوسمانی (باکووری کوردستان) لە بنەماڵەیەکی کوردی دیندار لەدایك بووە.
* لە نێوانساڵەکانی (١٨٧٦-١٩٦٠ز)دا ژیاوە.
* "صۆفی میرزا"ی باوکی بە پیاوچاکی بەناوبانگ بووە و، هەر خۆراکێك حەڵاڵ نەبووبێت دەرخواردی مناڵەکانی نەداوە.. خاتوو "نووریە"ی دایکیشی بە پاك و خاوێنی و دەستنوێژەوە نەبووبێت شیری بە مناڵەکانی نەداوە!
* دایکی لە کاتی جەنگی جیهانیی یەکەم و، باوکیشی لە ساڵەکانی بیستی سەدەی پێشوودا کۆچی دواییان کردووە و، لە گۆڕستانی گوندی "نوورس" نێژراون.
* چوارەم مناڵی خانەوادەکەیانە کە یەك لە دوای یەك ئەمانەن:
(دوڕڕییە، خانم، عەبدوڵڵا، سەعید، محەممەد، عەبدولمەجید، مەرجان).
* لە پێشدا لە لای "مەلا عەبدوڵڵا"ی برا گەورەی دەستی بە سەرەتاکانی خوێندن کردووە. پاشان چەندین گوند و شاری کوردستان گەڕاوە و، لای زانا گەورەکانی ئەو سەردەمە وانە گرنگەکانی خوێندووە.
* لە تەمەنی چواردە ساڵیدا بڕوانامەی زانایی لە زانستە ئیسلامیەکاندا بەدەست هێناوە.
* بە هەوڵ و تەقالای خۆی شارەزایی لە زانستەکانی ڕۆژگاردا، وەك: کیمیا، فیزیا، بیۆلۆجی، جیۆلۆجی، بیرکاری، گەردوونناسی، جوگرافیا، هتد.. پەیدا کردووە.

* لەبەر زیرەکیی نـاوازە و لە ڕادەبەدەری، نازنـاوی (سـەعیدی مەشـهوور) پاشـان (بەدیعوززەمان)ی لە لایەن زانایانەوە پێ دراوە.
* یەکەم کەسـە هەوڵـی داوە بـۆ دامەزرانـدنی زانکـۆ لە کوردسـتاندا و، کـردنەوەی قوتابخانەی کوردی و، خوێندنی وانەی زانستەکانی سـەردەم شـان بە شـانی زانسـتە ئاینییەکـان. لەم پێناوەشـدا لە لایەن دوا دەسـەڵاتدارانی دەوڵەتی عوسـمانییەوە ڕووبەڕووی چەندین گرفتی دژوار بووەتەوە.
* گەورەترین زانا و کەسایەتیی کوردی ئەم سەردەمەیە کە لە دوای مەولانـا خالیـدی نەقشـبەندی لەنـاو نەتەوەی کـورددا هەڵکـەوتووە و، ناوبـانگی جیهـانیی بـۆ دروسـت بـووە و، لە ڕووبەرێـکی فـراوانی سـەر زەویـدا سـوود لە بەرهەمەکـانی وەردەگیرێت.
* تاقانە کەسایەتی بووە کە هەموو زەبر و زەنگێکی ڕژێمـی مسـتەفا کەمـال و، سی و پێنج ساڵی بەندی و دوورخستنەوە و دەیان دادگای تـۆقێنەر نەیـانتوانیوە چـۆکی پـێ دابـدەن و لە خەبـاتی ڕەوای خـۆی کـۆڵی پـێ بـدەن. تەنـانەت ئەو توانیـویەتی سەرکەوتنیشیان بە سەردا بە دەست بهێنێت.
* زیاتر لە سەد و سی کتێب و نامیلکەی لە ژێـر ناونیشـانی (**سـەرجەمی پەیامەکـانی نوور**)دا نووسیوە و بڵاوی کردوونەتەوە.
* وەرگێـڕانی سـەرجەمی پەیامەکـانی نـوور بـۆ (زمـانی عەرەبی) لە لایەن مامۆسـتا (ئیحسان قاسم صـاڵحی)یەوە لە دە دانە بەرگـی گەورەدا تەواو بـووە و، لە وڵاتـانی تورکیا و میسـر و هیندسـتان و عەرەبسـتانی سعوودی چەنـد چـاپێکی یەك لە دوای یەکیان تا ئێستا لێ بڵاوکراوەتەوە.
* بەشێکی زۆریشیان لە لایەن خوشکی نۆموسڵمان ماری وێڵد (شوکران واحیـدە)وە کراون بە (زمانی ئینگلیزی) و، تا ئێستا چەندین بەرگی گەورەیـان بە چـاپی جـوان و مۆدێرن بەو زمانە لێ بڵاو کراوەتەوە.
*بە (**زمانی کوردی**)ش (**سەرجەمی پەیامەکانی نوور**)مان بە پشـتیوانیی خـوای گەورە لە نۆ بەرگی گەورەدا چاپ کردووە، جگە لە چل کتێب و نامیلکەی سەربەخۆ.

* هەروەها چەندین کتێبی تر کە بە زاری کرمانجیی ژووروو بڵاوکراونەتەوە.
* چەند بەشێکی ئەم پەیامانە بۆ ئەم زمانانەی خوارەوەش وەرگێڕراون، کە تا ئێستا کاری وەرگێڕان تیایاندا بەردەوامە:
(ئەڵمانی، ئەلبانی، ئیتاڵی، ئیسپانی، ئازەری، ئۆزبەکی، ئوردوو، ئیندۆنیسی، بەنگالی، بولگاری، بۆسنی، پرتوگالی، پشتۆ، تاجیکی، تەتاری، تاڵشی، تورکمانی، جۆرجی، چینی، دانیمارکی، ڕۆمانی، ڕووسی، ژاپۆنی، سانسکریتی، سلۆڤاکی، سەواحیلی، سویدی، فەڕەنسی، فیلیپینی، فارسی، ڤێتنامی، قەرغیزی، کازاخی، کۆری، کرواتی، گۆجیراتی، لاتینی، مالی، مالیزی، مەقەدۆنی، نەیجیری، هۆسا، هیبرۆ، هیندی، هەنگاری، هۆڵەندی، یۆنانی).
* تا ئێستا زیاتر لە شەست کۆنفرانسی جیهانی و دەیان کۆڕی زانستی و پێشبڕکێی ڕۆشنبیریی لە ئاستی جیهاندا لەسەر کراوە و، دەیان کتێب و، سەدان لێکۆڵینەوەی لەسەر نووسراوە و، چەندین بەڵگەنامەی زانکۆییشی لە خوێندنی باڵادا لەسەر وەرگیراوە، کە هەندێکیان لە کوردستاندا بووە.
* لە وڵاتی هیندستان پەیمانگایەکی تایبەت بە ناساندنی مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی دامەزراوە، کە خوێندن تیایدا بەردەوامە.
* دواهەمین گەورە کۆنفرانسی زانستیی جیهانی لەسەر مامۆستا بەدیعوززەمان لە شاری ئەستەمبوڵ لە بەرواری (١-٣/١٠/٢٠١٧ز)دا بەڕێوەچوو، کە زیاتر لە سەد توێژینەوەی زانستیی تێدا تاوتوێ کرا و، چەند توێژەرێکی باشووری کوردستانیش بەشدارییان تێدا کرد.
* لە باشووری کوردستاندا، هەتا ئێستا سێ سیمینار تایبەت کراوە بە مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی، لە شارەکانی (هەولێر، سلێمانی، سۆران).
* هەروەها کۆڕبەندێك لە بەرواری (٢١/١٢/٢٠١٣ز) لە شاری هەولێر لە لایەن پەیمانگای زانستە ئیسلامیەکان و وەزارەتی ئەوقافی حکوومەتی هەرێمی کوردستانەوە ڕێکخرا بە بەشداریی چەند توێژەرێکی ناوخۆی کوردستان و وڵاتی تورکیا و، بە ئامادەبوونی دەیان کەسایەتیی زانستی و ئایینیی عێراق و هەرێم.

* هەروەها لە بەرواری (٢٠١٥/١٢/١٢ز)دا لە شاری هەولێر نەدوەیەکی زانستی لە لایەن (ڕێکخراوی پەیامی پاك)ەوە بۆ مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی ساز کرا بە ناوی "نووری نبووەت لە پەیامەکانی نووردا" کە چەند توێژەرێکی زانکۆی دیجلەی باکووری کوردستانیش بەشدارییان تێدا کرد.

* هەروەها لە بەرواری (٢٠١٦/٣/٢٦ز)دا لە شاری هەولێر لە لایەن (ئەمینداریێتیی گشتیی ئەنجومەنی زانایانی عێراق)ەوە و بە بەشداری لەگەڵ سەنتەری ڕۆشنبیریی (وقف الخيرات)دا نەدوەیەکی ڕۆشنبیری بە ناوی (الإمام بديع الزمان سعيد النورسي ومنهجه في إحياء الإيمان) بەڕێوەچوو کە چەند باس و بابەتێکی بە زمانی عەرەبی تێدا پێشکەش کرا.

* دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم لە شاری سلێمانی لە ساڵی (٢٠١٦)دا ژمارە (٨٩)ی بڵاوکراوەی (ڕۆڤار)ی تایبەت کرد بە مامۆستا نوورسی بە ناوی (سەعید نوورسی.. کلیلی گەنجینەیەکی شاراوە).

* هەتا ئێستا لە باشووری کوردستاندا شەش مزگەوت بە ناویەوە ناونراوە لە شارەکانی (سلێمانی، سۆران، کەرکووك، هەولێر، پێنجوێن، هەڵەبجە).

* * *

# پێڕستی بابەتەکان


| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| پێشەکی .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. | ٥ |
| دەستوورەکانی تێگەیشتن لە فەرموودەکان .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. | ٧ |
| موناقەشەیەك لەسەر فەرموودەیەکی پیرۆز .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. | ٣٥ |
| چەند مەسەلەیەك لە دووتوێی یەك مەسەلەدا .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. | ٤٤ |
| لە نێوان "حەقیقەت" و "تەشبیهـ"دا .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. | ٤٧ |
| لە نێوان "حەقیقەت" و "مەجاز"دا .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. | ٥٦ |
| لە نێوان "پوختەلێدوان" و "درێژەپێدان"دا .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. | ٦٠ |
| پوختەیەك لە ژیانی دانەر .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. .. | ٦٥ |


* * *

چەند بناغەیەك بۆ

# تێگەیشتن لە فەرموودەکان

فەرموودەکان و، پلە و پایەیان و، مەودای تێگەیشتن لێیان، دەریایەکی بەرین و مەیدانێکی فراوانە، مەگەر هەر زانا و پسپۆڕانی ئەو بوارە بتوانن مەلەوانی ئەو دەریایە و سوارچاکی ئەو مەیدانە بن و، مافی تەواوی پێ بدەن.. بەڵام کەسانی تریش پێویستیان بە چەند "بناغە" و "دەستوور" و "تەرازوو"یەکە لە ڕێیانەوە بتوانن بە ئاسانی و دوور لە وردەکاریی زاراوەکان لە گەڵێ ئامانجی فەرموودە پیرۆزەکان تێبگەن و، وەهمەکان بەهەڵەیاندا نەبەن.

دانەر لەم نامیلکەیەدا هەوڵی داوە، بە دانانی کۆمەڵێك بناغە و دەستوور، بەرچاوڕۆشنی سەبارەت بە چەندین لایەنی ئەو بوارە بە خوێنەر ببەخشێت.

## أُصُولٌ في فَهْمِ الأحاديث

من كليات رسائل النور

التي ألفها الأستاذ:

بديع الزمان سعيد النورسي

(رحمه الله)

## Some Principles for Understanding Hadiths

From
The Risale-i Nur Collection
By:
Bediuzzaman Said Nursi

0-0262-0000-7
9 780026 200004

نرخی (١٠٠٠) دیناره